

هەڵبژاردنی الشيخ
أحمد بن يحيى النجمي رحمه الله
لە بابەتی ڕۆژوو
لە کتێبی
(تأسيس الأحكام - شرح أحاديث عمدة الأحكام)
نوسينی:
الشيخ علي بن يحيى الحدادي
وەرگێڕانی: هشام لطيف البرزنجي
پێداچوونەوەی: م . صلاح الدين عبدالكريم

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه:

له پاشاندا:

ئەمە هەڵبژاردنی شێخمان زانای پایەبەرز فەرمودەناسی فەقیهـ أحمد بن يحيى النجمی -خوای گەورە بیپارێزێت سودمان پێ بگەیەنێت بە عیلمەکەی- ئەم بابەتە پەیوەندی بەڕۆژووەوە هەیە وە ئەوەی پەیوەستە پێوەی شێخ بڕیاریداوە لەسەری لە شەرحی (عُمدةُ الأحكام)، ئەوەی دەرچووە چاپی یەکەم لە چاپخانەی (دار المنهاج) لە میسر ساڵی (١٤٢٧ کۆچی) بۆ ئاگاداری خوێنەر کە دارشتنەوەی برگەو ڕستەکان کاری خۆمە پەیوەست نەبوومە بە وتەکانی شێخەوە لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی تەواوم داوە ئەم دەستکارییە کاریگەری نەبێت لەسەر واتا، والله الموفق.

١- باشترین وتەیەك کە وترابێت دەربارەی پێناسەی ڕۆژوو بریتی یە لە: خۆگرتنەوەی موسڵمانێکی عاقڵ یان ئافرەتێکی موسڵمانی عاقڵ کە بێنوێژیو زەیستانی نەبێت لە خواردنو خواردنەوە شەهوەت لە دەرکەوتنی فەجری دووەمی بەیانی تا خۆرئاوابوون بە نییەتی ڕۆژووگرتن. (نییەت شوێنەکەی دڵە -وەرگێڕ-).

٢- حەرامە ڕۆژووگرتنی (یوم الشك -ڕۆژی گومان-) بە نییەتی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

٣- هیچ تێدانییەو ئاسایی یە ڕۆژووگرتنی (یوم الشك -ڕۆژی گومان-) بۆ کەسێك کە عادەتی وابوبێت بۆ نمونە دوشەممان بەڕۆژوو دەبێت، ئەو ڕۆژی گومانە بکەوێتە ئەو ڕۆژەوە.

٤- هەرکەسێك ڕۆژووی (یوم الشك -ڕۆژی گومان-) بگرێتو بەردەوام بێت لەسەری ئەو ڕۆژە، وە بۆی ڕون ببێتەوە کە ئەو ڕۆژە ڕەمەزانە ئەوا دەبێت ئەو ڕۆژە بگرێتەوە.

٥- بینینی مانگ دەبێت بە چاو ببینرێت پەند وەرگرتن بە (ڕۆژ ژمێر

نیە، وە پشت نابەسترێت بە (میکرۆسکۆب).

٦- مانگی ڕەمەزان دادەمەزرێت بە شایەتی دانی کەسێکی -عَدل- دادپەروەر وە ئەوەندەی بەسە بۆ دادپەروەرییەکەی کە موسڵمان بێت، بەڵام بۆ تەواوبوونی مانگی ڕەمەزان پێویستی بە دوو شایەت هەیە.

٧- خەڵکی هەر وڵاتێك بە بینینی خۆیان بۆ مانگ بەڕۆژوو دەبن، بەڵام ئەگەر لە وڵاتێك مانگ نەبینرا ئەوا ئەو وڵاتانەی دوای ئەمان پێویستە بەڕۆژوو بن لەگەڵیاندا، چونکە ئەگەر خۆر پێش مانگ بکەوێت لە وڵاتێك ئەوا وا پێویست دەکات زیاتر پێش بکەوێت لە وڵاتانی دواتر، بەڵام پێویست نی یە وڵاتانی پێشیان بەڕۆژووبن.

٨- پارشێوکردن سوننەتە، وە دەبێتە واجب لە کاتێکدا ئەگەر وازلێهێنانی زەرەر بە کەسی ڕۆژووەوان بگەیەنێت.

٩- ئەگەر فەجر دەربچێت پێش ئەوەی کەسەکە خۆی بشۆرێت لە لەشگرانییەکەی بەهۆی جیماع یان خەوبینین دەست دەگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە ڕۆژووەکەی دروستە.

١٠- ئەگەر ئافرەت پێش دەرکەوتنی فەجر لە سوڕی مانگانە پاك بووەوە و خۆشوشتنەکەی خستە دوای دەرکەوتنی فەجر دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵدەگرێت و ڕۆژووەکەی دروستە.

١١- ئەگەر کەسێك بە لە بیرچوون بخوات و بخواتەوە ڕۆژووەکەی ناشکێت.

١٢- هەرکەسێك جیماع بکات بە لەبیرچوونەوە ئەوا ڕۆژووەکەی دەشکێت، لەبەرئەوەی لە بیرچوون ناکرێت کە دوو کەس تێیدا بەژداربن، وە پێویستی بە هەندێك پێشەکی هەیە وەکو داخستنی دەرگا و پۆشاك داکەندن و غەیری ئەوە، وە کەفارەتی دەکەوێتە سەر.

١٣- هەر کەسێك توشی تاوانێك ببێت و ئەنجامی بدات کە سزای لەسەر نەبێت و هات پرسیاری کرد ئەوا سزا نادرێت.

١٤- هەرکەسێك بە ئەنقەست جیماع بکات ئەوا کەفارەتی دەکەوێتە سەر، وە وتراوە: واجب نیە، ئەوە وتەیەکی لاوازە پشتی پێ نابەسترێت.

١٥- تەرتیب لە کەفارەت واجبە. کە ئازادکردنی کۆیلەیەکە پاشان ڕۆژوو پاشان پێدانی خواردن بە هەژاران وە نابێت بگوازرێتەوە بۆ ئەوەی دواتر مەگەر ئەو کەسە نەتوانێت.

١٦- دەبێت ئەو کۆیلەیە: ١- بە هۆکارێکی شەرعی بووبێتە کۆیلە. ٢- پارێزراوبێت لە عەیب و عار ٣- دەبێت باوەڕداربێت.

١٧- ئەو وتەیە لەو کەسە وەردەگیرێت کە کەفارەتی کەوتووەتەسەر لە نەبوونی توانای، وە ئەوەش لەسەر ئەو کەسە پێویستە کە قسەی بۆ دەکات بە

دواداچوونی ئەو کەسە بکات پرسیار بکات تا بۆی ڕوون ببێتەوە هۆکارەکەی شەرعییە یان نا، لەبەر لاوازی باوەڕبون بە ڕاستگۆیی خەڵکی ئەم سەردەمە.

١٨- یەکێك لە هۆکارەکانی توانای بەڕۆژوو نەبوون بوونی ئارەزوی زۆرە بۆ جیماع - نەبوونی ئارامگرتنە لەسەر جیماع-، وە هەر ئەویش کەسابەتی ماڵەکەی دەکات وە ڕۆژووگرتن لاوازی دەکات بۆیە زەرەر دەدات لە مناڵەکانی.

١٩- لە خواردن پێدان ئەوە پێویست نابێت بە ژمارە بێت، بەڵکو ئەوەی پێویست دەبێت خواردنی شەست هەژارە لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا خواردنی شەست فەقیری دا بەو کەسەی کە کەفارەتی کەتبووەسەر، وا گومان دەبرێت لە دە کەس زیاتر نەبوونە.

٢٠- هەرکەسێك نەتوانێت کەفارەت بدات لەو کاتەدا ئەوا لەسەری نامێنێت.

٢١- ئەگەر ئەو کەسەی کەفارەتی دەکەوێتە سەر هەژارترین کەسی ئەو شارەبێت ئەوا خۆی خواردنەکە دەخوات.

٢٢- هەرکەسێك نەتوانێت کەفارەت بدات ئەوا پێویست دەبێت لە ماڵی موسڵمانان بۆی بدرێت.

٢٣- ئایە پێویست دەبێت لەسەر کەسێك کە ڕۆژووەکەی شکابێت بەهۆی -جیماع-ەوە قەزای بکاتەوە؟ خیلافی لەسەرە. وە شێخمان (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بڕیاری نەدا لەسەر هیچیان.

٢٤- تەنها مێردەکە کەفارەت دەکەوێتە سەری ئەگەر -جیماع-یان کردبوو ئەگەر ژنەکەشی ڕازی بووبێت لەسەر ئەو کارە، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا پرسیاری لەو کەسە نەکرد کە جیماعی کردبوو لەگەڵ خێزانی ئایە خێزانەکەت ڕازی بووە یان نا، وە لەبەرئەوەی چێژی جیماع هاوبەشە لەنێوان ژن و پیاو وە لەگەڵ ئەوەشدا شەرع مارەیی و نەفەقە و پۆشاکی داناوە لەسەر پیاو بە تەنها بۆیە کەفارەتیش دەکەوێتە سەر پیاوەکە، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە هۆکار بووبێت ئەوا کەفارەت دەکەوێتە سەر ژنەکەش.

٢٥- ئەگەر ڕۆژووگرتنەکە لە ماوەی ئەو دوو مانگە بچڕانی تێکەوت لەبەر ناچاری ئەوا ڕۆژووەکانی پێشوی بۆ حسابە.

٢٦- ئەگەر (جیماع)کردنەکە دووبارە بووەوە لە چەند ڕۆژێکدا پێش ئەوەی کەفارەت بدات ئەوا پێویستە لەسەری بۆ هەر ڕۆژێکی کەفارەت بدات، بەڵام ئەگەر (جیماع)کردنەکە دووبارە بووەوە لە یەك ڕۆژدا ئەوا یەك کەفارەت لەسەری پێویستە.

٢٧- پرسیارکردنی (حمزە لە کوڕی عمرو أسلمي (ڕەزای خوای لێبێت)) دەربارەی ڕۆژووگرتن لە کاتی سەفەردا مەبەست پێی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بووە.

٢٨- هەرکەسێك بەڕۆژوو ببێت لە سەفەردا ئەوا ڕۆژووەکەی دروستە وە قەزاکردنەوەی لەسەر نییە. وە ڕۆژوو شکاندنی باشترە ئەگەر ناڕەحەتی بۆ دروست بکات ڕوبەڕوی مەترسی نەکاتەوە.

٢٩- ڕۆژوو شکاندن واجب دەبێت لە کاتی سەفەردا لە دوو حاڵەت:

یەکەم: ئەگەر هاتوو ڕۆژووەکەی زەرەری لێبدات.

دووەم: ئەگەر ڕوبەڕوی دوژمن نزیك بووەوە.

٣٠- ئەگەر سەفەرێك ناڕەحەتی تێدا نەبوو ئایە بەڕۆژوو بوون باشترە یان شکاندنی ڕۆژووەکە؟

سەیر دەکرێت: ئەگەر ناڕەحەتی دروست کرد لە ڕۆژوو گرتنەوەکەی زیاتر لەوەی کەوا بەڕۆژوو ببێت ئەوا یەکسانە بەڕۆژوو ببێت یان بیشکێنێت، وە ئەگەر ڕۆژووگرتنەوەکەی ناڕەحەتی دروست نەکات ئەوا ڕۆژووەکەی با

بشكێنێت وەكو ڕێپێدانێك بۆی.

٣١- خزمەتكردنی نەفس باشترە لە عیبادەتە سوننەتەكان، لەبەر ئەوەی فەرموودەیە: (ئەوانەی ئەمڕۆ ڕۆژوویان شكاند بە پاداشتی زۆر گەورە گەڕانەوە). -حديث صحيح: صحيح أبي داود، ٢٠٨٠).

٣٢- كاتی قەزا كردنەوە فراوانە، وە تەسك نابێتەوە تا ئەو كاتەی دەچێتە ناو مانگی شەعبان.

٣٣- ئەگەر كەسێك قەزاكردنەوەكەی دواخست بەبێ ئەوەی عوزری هەبێت تا ڕەمەزانێكی تر ئەوا تاوانبارە. وا گومان دەبەم خواردن لەسەری واجبە لەگەڵ قەزاكردنەوەی ڕۆژووەكە.

٣٤- ئافرەت ڕۆژووی قەزا ناگرێت ئیللا بە ڕێپێدانی مێردەكەی نەبێت ئەگەر كاتەكەی فراوان بوو.

٣٥- ئەو كەسەی بمرێتو ڕۆژووی لەسەر بێت ئەوا پێویستە لەسەر ئەوانەی میراتی لێ دەبەن لە جێی بەڕۆژوو ببنەوە.

٣٦- -وَلي- ئەو كەسەیە ڕاستەوخۆ میرات دەبات، ئەگەر ئەوانەی ڕاستەوخۆ میراتی دەبەن هەندێك بوون ئەوا ئەوەی لە هەمووی نزیكترە ئەوەیان لەجێی بەڕۆژوو دەبێت، یان بەژداری تێدا دەكەن بە یەكەوە. ئەگەر هەموویان بەژداربوون تێیدا ئەوا نابێت هەموویان بەیەكەوە لە یەك ڕۆژدا بەڕۆژوو بن، بەڵكو لە دوای یەك بەڕۆژوو دەبن چونكە قەزاكردنەوە دەبێت بەدوای یەكدابێت.

٣٧- هەركەسێك نەخۆشییەكەی بەردەوام بێت تا دوای ڕەمەزان وە تا دەمرێت ئەوا لەسەر كەسەكانی نییە كەوا ڕۆژووەكانی بۆ بگرنەوە.

٣٨- دەبێت زوو ڕۆژوو بشكێنرێت وە پارشێو دوابخرێت.

٣٩- كە خۆر ئاوابێت ڕۆژووەوان ڕۆژوو ناشكێنێت تەنها بە كرداری خۆی نەبێت (خۆی ڕۆژووەكە دەشكێنێت) وە دانانرێت كە بە حوكم ڕۆژووی شكاندبێت وەكو هەندێك دەڵێن، چونكە پێغەمبەر ﷺ ویسالی كردووە بە هاوەڵانی، ئەگەر تەنها بە خۆر ئاوابوون حوكمی ڕۆژوو شكاندنیان هەبوایە ئەوا ویساڵ هیچ مانایەكی نابوو.

٤٠- مەکروهــە بــە دوای یەکـدا بــەڕۆژووبوون -ڕۆژووەکــە نەشــکێنێت تــا ڕۆژێکی تر-، حەرام نییە جگە بۆ کەسێك کە توشی ناڕەحەتی بکات.

٤١- قەدەغــەکراوە کەســێك ســاڵ دوانــزەی مــانگ هــەموو ڕۆژەکــان بــەڕۆژوو ببێـت لــە نێـوان مــەکروە و حەرامدایــە، پەنـد وەرگـرتن لەســەر باشــی کردەوەکـان ئەوەیە بەپێی شەرع بێت نەك بە زۆری کردەوە.

٤٢- کــاتی نیــوەی شــەو یــان ســێ یــەکی یان شــەش یــەکی دەســت پێـدەکات لــە دوای عیــشاوە لەبەرئــەوەی پــێش عیــشا کــاتی شــەونوێژ نیــە. (ئــەوەی لــە قــسەی شــێخ دەردەکــەوێت ئەوەیــە کــە ئەمــە هەڵبــژاردەی خۆیــەتی (ڕەحمــەتی خوای لێبێت) والله أعلم).

٤٣- ویــستی خۆیــەتی کەســێك لــە مانگێــك ســێ ڕۆژ بــەڕۆژووبێت یــان ســێ ڕۆژی (١٣، ١٤، ١٥) لە مانگی کۆچی وە ئەگەر ویستی غەیری ئەو ڕۆژانە.

٤٤- دوو ڕکـــاتی نوێـــژی چێـــشتەنگاو ســـوننەتە. کـــەمترینیان دووە، وە زۆرییەکــەی هەشــت ڕکاتــە. هەرکەســێك بلێــت زۆرییەکــەی دوانــزە ڕکاتــە ئــەوا پشتی

بەستووە بە فەرموودەی لاواز.

٤٥- باشــتر وایــە نوێـژی ویـتر لــە کۆتــایی شــەودا بێـت، وە ئەگــەر کەسێك نەیتوانی شەو هەڵسێت ئەوا پێش ئەوەی بخەوێت با بیکات.

٤٦- کەراهــەتی هەیــە ڕۆژی هــەینی تایبــەت بکرێــت بــە ڕۆژووگــرتن وە کەراهەتــە نامێنێــت ئەگــەر ڕۆژێــك پیــشی یــان پاشــی بــەڕۆژووبێت. وە پێویــست ناکـات بـەدوای ئـەوەدا گـەڕان بکرێـت بۆچـی قەدەغـەکراوە لەسـەر بەڕۆژوونـەبوونی ڕۆژی جومعـە بـەڵکو ئەوەنـدە بەسـە کـە موسـڵمان شـوێنکەوتە بێـت دەسـت بگرێـت بە سوننەتەوە.

٤٧- ئەگــەر ڕۆژوویــەکی ســوننەت بکەوێتــە ڕۆژی جومعــەوە ئــەوا ســوننەتە تێیــدا بــەڕۆژووبوون وەك: عاشــورا یــان ڕۆژی عەرەفــە لەبەرئــەوەی تایبــەتکردنی جومعە نیە بە بەڕۆژووبوون.

٤٨- حەرامــە بــەڕۆژووبوون لــە ڕۆژی جەژنـدا ئەگــەر کەسێك نــەزری کردبێـت و بکــەوێت جەژنیــشەوە، بــەڵکو ڕۆژژوەکــەی دەشــکێنێت و لــە ڕۆژێکــی تــر بــەڕۆژوو

دەبێت.

٤٩- حەڵاڵ نییە جەژنێکی تر دابهێنرێت لە ساڵدا جگە لە جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان.

٥٠- ڕۆژی جەژن نابێتە هۆی بچڕاندنی ڕۆژووی کەفارەت، بەڵکو ڕۆژووەکە دەشکێنێت و دوای ئەوە بەڕۆژوو دەبێتەوە.

٥١- بەڕۆژووبوونی ڕۆژێك لە پێناو خوای گەورە ئەوە دەگونجێ لە مەبەستی تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، وە دەگونجێت مەبەست پێی جیهادکردن بێت ئەگەر دووەم بێت ئەوا مەبەست پێی ئەوەیە کە ڕووبەڕووی دوژمن نزیك نەبێتەوە ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمن نزیك بووەوە ئەوا حەرامە ڕۆژووگرتن.

٥٢- شەوی قەدر ناگوازرێتەوە بەڵکو ئەو شەوەیە بە دیاریکراوی لەبەر فەرموودەکە: (شەوی قەدرم پێشاندرا پاشان لە بیرم چوو) -سلسلة الأحاديث الصحيحة: (٣٩٨٥)-. لە مانگی ڕەمەزانە لە حەوت شەوی کۆتاییدایە.

٥٣- ئەگەر کەسێك -اعتکاف-ی کردوو کەوتە جومعەوە ئەوا واجبە لەسەری جومعەکە لەو شوێنە بکات کە تێیدا -اعتکاف-ی کردووە، ئەگەر نا ئەوە -اعتکاف-ەکەی لە مزگەوتی جەماعەتدا دروستە.

٥٤- دروست نییە بۆ ئافرەت کە -اعتکاف- بکات بە تەنیا بەڵکو دەبێت لەگەڵ مێردی بێت یان کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدا بێت، لەگەڵ ئەوەی دەبێت داپۆشراوبێت و ئەمین بێت لە فیتنە، وە نابێت ڕێگە لە پیاوان سەغڵەت بکات.

٥٥- ڕۆژوو مەرج نی یە بۆ -اعتکاف- بەبێ بەڕۆژوو بونیش دەبێت لە جگە لە ڕەمەزان.

٥٦- ئایە بۆی -اعتکاف-ەکەی ببڕێت لە پاش ئەوەی دەچێتە -اعتکاف-ەوە ؟ جمهوری زانایان: لەسەر ئەوەن کە دەیبچڕێنێت. وە وتراوە: نایبچڕێنێت مەگەر نییەتی قەزا کردنەوەی لێ بێنێت. شێخ (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بڕیاری نەدا لەسەر هیچیان.

٥٧- کەی کاتی -اعتکاف- دێت؟ ئایە لە دوای نوێژی بەیانی ڕۆژی بیست و یەك یان دوای خۆرئاوابوون لە بیسی ڕەمەزان؟ شێخ (ڕەحمەتی خوای

لێبێت) بڕیاری نەدا لەسەر هیچیان.

٥٨- دروست نیە بۆ کەسێك کە -اعتکاف- بکات سەردانی نەخۆش بکات وە نابێت حازربێت لەسەر جەنازە ئیللا ئەگەر بە مەرجی دانا، قیاس لەسەر بە مەرج دانان لە ئیحرامدا.

٥٩- دروست نیە جیماع کردن و پێشەکییەکانی بۆ کەسێك کە لە -اعتکاف-دا بێت.

٦٠- -اعتکاف- لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان سوننەتێکی جەخت لەسەرکراوە وە لە غەیری ئەوە سوننەتێکە.

٦١- -اعتکاف- بەتاڵ نابێتەوە ئەگەر هەندێك لە لاشەی ئەو کەسە بکەوێتە دەرەوە.

٦٢- کەسێك کە -اعتکاف- بکات نابێت دەربچێت جگە بۆ حاڵەتێکی زەروری کە وە دروست نییە کە کەسێکی تر لە جێی خۆی دابنات.

٦٣- دروستە نەزرکردنی کەسی کافر ئەگەر موسڵمان بێت وەفای هەبێت بۆ نەزرەکەی.

٦٤- دروستە -اعتکاف- بەستن لە ڕۆژێك کەمتر، لەبەرئەوەی بنەما لە شەرعدا ئەوەیە بە ڕۆژێك یان زیاتر ئەوا ڕێگرنیە بە کەمتر لە ڕۆژێك.

٦٥- دروستە سەردانی کەسێك بکەیت کە لە -اعتکاف-دا بێت وە قسەی لەگەڵدا بکەیت، وە دروستیشە کە هەواڵ بدرێت کێ سەردانی کردووە.

والله أعلم وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله محمد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين

٢٢/٨/١٤٢٨هـ الشيخ علي بن يحيى الحدادي

١٩/٨/١٤٤١ هـ - یەك شەممە- هشام لطيف البرزنجي